# گەوهەر و یاقوت لەڕاستی کوفرکردن بە تاغوت

نووسینی

الشيخ خالد بن علي المرضي الغامدي

وەرگێڕانی

ابو موحەمەدی موهاجير





فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا



# گەوهەر و یاقوت لە ڕاستی کوفرکردن بە تاغووت

نوسینی : الشیخ خالد بن علی المرضی الغامدی

وەرگێڕانی : ابو موحەمەدی موهاجیر

ئامادەکردنی: کۆمەڵی ڕزگـــــاربوو

الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على المبعوث بالسيف رحمة للعالمين وعلى آله وأصحابه والتابعين.

پاشان:

ئەمە کتێبی گەوهەر ویاقووت لەنێوان ڕاستەقینەی کوفر بەطاغووت، نەهەنگێک مرواری ومەرجانی بڵاوکردەوە، هەرکەسێ کاری پێ بکات گەوهەر و یاقووت وەردەگرێت لەلایەن "الحيُ" تبارك وتەعالا، هەرکەسێ لەسەر ئەوە بمرێ ڕزگاری ئەبێت وڕەوح وڕەیحانی بۆ دەڕازێنرێتەوە وئەگاتە لای پەروەردگاری ڕەزامەند لێی وبەبێ تووڕەبوون.

داواکاری فەزڵی -الله- ین کە بمرین لەسەر تەوحید.

سەبارەت بەم بابەتانەش هەموو موسڵمانێک پێویستی پێیەتی لەبەرئەوەی ئەم عەقیدە پایەبەرزە دینی هیچ کەسێک ڕاست نابێتەوە ئیلا بەبەجێهێنانی واتاکەی وهیچ کەسێکیش ناچێتە بەهەشتەوە بەبێ ئەم عەقیدەیە، کە کردوومەتە نێو چوار کتێبەوە.

یەکەم : حقيقة الكفر بالطاغووت . (ڕاستەقینەی کوفر بەطاغووت)

دووەم : (ملة إبراهيم ومعتقد التكفير) وجوب معاداة الكفار وتكفيرهم . ((میللەتی ئیبراهیم وبیروباوەڕی تەکفیر کردن) واجب بوونی دژایەتی کافرەکان وتەکفیر کردنیان)

سێیەم : قواعد الولاء والبراء . (بنەماکانی وەلاء وبەڕاء)

چوارەم : مظاهرة الكفار . (سەرخستنی کافرەکان)داواکارین لە -الله- بەتەنها خۆی لێمان قبوڵ بکات وکردەوەمان چاک بکات وە -الله تعالا- زاناترە وصل الله وسلم على نبينا محمد والحمدلله رب العالمين.

أبو علی نوسیویەتی

لەماڵی غامد لەذی الحجەی ساڵی ١٤٣١هـ

ئەم کتێبەش یەکەم کتێبە لەکوفر بەطاغووت، تێیدا پێناسەی طاغووتم ڕوونکردووەتەوە وڕاستی وچۆنیەتی کوفر بەطاغووت .

نووسیمەوە کاتێک بینیم ئەم عەقیدەیە سڕاوەتەوە لەنێو خەڵکیدا هەرچەندە خەڵکی هیچیان لێ وەرناگیرێت ئیلا بەم عەقیدەیە، هەتا بوونە باوەڕدار بەطاغووت ئەیپەرستن ولەپێناویدا ئەجەنگن وگوێڕایەڵی ئەکەن ولەشوێن هەنگاوەکانی ئەڕۆن وازیان هێناوە لەوەی کوفری پێ بکەن وجێی بهێڵن وخۆیانی لێ بەدوور بگرن وتەکفیری بکەن -الله پشتیوانمان بێت- .

داواکارم لە -الله- سوودی لێ وەربگیرێت وبیکاتە ڕاستییەک بۆ بەندایەتی بۆخۆی وبەدڵسۆزییەوە لێم وەربگرێت بەپەیوەست بەشەرعەوە .

## بابەتی یەکەم : پێناسەی طاغووت :

یەکەم : واتای زمانەوانی طاغووت :

طاغوت : لەسەر وەزنی (فعلوت)ە، کەئەم وەزنە بۆموبالەغە وزیادەڕەوی بەکاردەهێنرێت، بۆنموونە: جبروت، ملکوت .

دەستەواژەی طاغووت وەرگیراوە لە کرداری : طغى، يطغى، طغيا، يطغو، وطغيانا (زیادەڕەوی کرد، زیادەڕەوی دەکات، زیادەڕەو، زیادەڕەوی، زیادەڕەوانە) ئەگەر سنووری خۆی ببەزێنێت لەتاوان وسەرپێچی وبەرزەوەبێت وزیادەڕەوی بکات لەکوفر، لەوانەش; طغى الماء (ئاوی دەریاکە زۆربوو لێی ڕژا) هەروەک الله تەعالا دەفەرموویت: (إِنَّا لَمَّا طَغَى الْمَاءُ } واتە:{سنووری بەزاند وشەپۆلەکانی زیادی کرد} وە هەرشتێ سنووری خۆی ببەزێنێت ئەوا زیادەڕەوی (طغى)ی ئەنجام داوە، وهەرکەسێ سنووری خۆی ببەزێنێت لەتاوان وسەرپێچی ئەوا زیادەڕەوە (طاغٍ) .

وناوی طاغووت هاتووە لەبەرئەوەی زیادەڕەوی کردووە وسنووری خۆی بەزاندووە لەکوفر .

بەڵام لەدەستەواژەدا : چەند پێناسەیەکی بۆکراوە ڕێک وپێک ترینیان ئەم دووانەیە :

یەکەم : طاغووت هەرشتێکە سنوور ببەزێنێت لەشوێنکەوتن یان گوێڕایەڵی کردن یان پەرستن .

دووەم : هەرشتێک بپەرسترێ لەبری الله وئەویش پێی ڕازیبێت، هەرچەندە ئەگەر لەبابەتێکی عەقیدەییشدا بێت .

١- هەرکەسێ لەلایەنی خۆشەویستی ودۆستایەتی دوژمنایەتی بۆبکرێ ئەوا طاغووتە .

٢- هەرکەسێ لەلایەنی گوێڕایەڵی وشوێنکەوتن وحوکم گێڕانەوە وشەرع دانانەوە بەندایەتی بۆبکرێ ئەوا طاغووتە .

٣- هەرکەسێ لەلایەنی دوعا وترس ونە زر ونسک بەندایەتی بۆبکرێ ئەوا طاغووتە .

٤- هەرکەسێ لەو لایەنەوە بەندایەتی بۆبکرێ کەڕەزامەندبێت بەوەی تایبەتمەندیەکانی ئولوهیە یان بەشێکی بدرێتە پاڵی ئەوا طاغووتە .

ئەچێتە ناو ئەم پێناسەیەوە هەرکەسێ فەرمان بەکوفر بکات یان ڕازیبێت بەشتێک دەری بکات لەدین بەبێ شک وگومان، جیاوازی نییە ئەگەر پەرستن بێت یان شوێنکەوتن یان گوێڕایەڵی..هتد

## بابەتی دووەم : داڕشتەی طاغووت :

طاغووت داڕشتەیەکە بۆ تاک وکۆ ونێر ومێ بەکاردەهێنرێت .

الواحدی دەڵێت : ئەهلی زمانەوانی دەڵێن : طاغووت هەرشتێکە لەبری الله بپەرسترێ ، ئەگەرچی یەک کەس بێت یان کۆمەڵێ یان نێربێ یان مێ، الله تەعالا دەفەرموویت : { يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ }(النساء:٦٠) واتە: دەیانەوێت ڕووبکەنە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لەکاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە باوەڕیان بە (تاغوت) نەبێت

ئەمە بۆ تاک بوو، هەروەها الله تەعالا بۆ کۆمەڵ دەفەرموویت : {وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ} (البقرة:٢٥٧) واتە: ئەوانەش کە ڕێبازی کوفریان گرتۆتەبەر، یارمەتی دەرەکانیان تەنها ـ تاغوتەکانە، لە نوورو ڕووناکی دەریان دەهێنن و بەرەو تاریکاییەکان دەیانبەن.

بۆ مێینەش دەفەرموویت : {وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا }(البقرة:٢٥٧) واتە: جا ئەوانەی کە خۆیان دوورە پەرێز گرتووە لە هەموو ئەو شتانەی خەڵکی دەیپەرستن.

کۆی طاغووت : طەواغیت یان طەواغی، لەفەرموودەدا هاتووە : (سوێند مەخۆن بەباوک وباپیرتان وهەروەها بە طەواغی) لەڕیوایەتێکی تر (بە طەواغیت)، کەواتە طەواغی کۆی طاغووتە، کەبریتییە لەئەو شتانەی لەسەردەمی جاهیلیەت ئەیانپەرست بت وشتی تر، لەوانە : (ئەمە طاغووتە دەوس وخەثعەم) واتە بتەکەیان وپەرستگاکەیان، ئەشبێت مەبەستی لە طەواغی ئەوەبێت کەزیادەڕەوی کردبێت لەکوفر وسنوری خۆی بەزاندبێت، ئەویش گەورەکانیان وکاربەدەستەکانیان بوون، بگەڕێوە بۆ [لسان العرب] .

## بابەتی سێیەم : جیاوازی نێوان کوفر و طاغووت :

هەموو کافرێک طاغووت نییە، وهەموو کوفرێکیش بە "بەواح" هەژمار ناکرێت، ڕەنگە کوفری "مجرد" یان "مغلظ" بێت کافریش تێیان هەیە "ئاسایی" هەیە "طاغووت" هەیە "شتی تر .

لەبەرئەوە طاغووت ئەوەیە کەسنووری بەزاندبێت لەکوفر .

هەروەها ڕەنگە هەندێ جار ناوی طاغووت بەکاربهێنرێت بۆ غەیری کافر، کە مەبەستی لەواتا ڕیزمانییەکەی بێت، کەئەویش سنوور بەزاندن ودەستدرێژی کردنە، وەکو ناوهێنانی هەندێک لەپێشەوای زاڵم لەلایەن پێشینان وسەلەفمانەوە بۆنمونە "حجاج" وهەتادوای، ئەوان ناویان ئەهێنا بەطاغووت و وەسفیان دەکرد بەطوغیان.

## چوارەم : گشت پەرستراوێک پێی ناووترێ طاغووت :

ئەشێ طاغووت زیندوو بێت یان بێ گیان، پەرستراوەکە ئەگەر زیندوو بێت وپەرستنەکەی بەڕەزامەندی خۆی بێت ئەوا طاغووتە ئەگەر بەڕەزامەندی خۆی نەبێت ئەوە طاغووت نییە، کەواتە فریشتەکان وپێغەمبەر عیسا طاغووت نیین وناویان ناهێنرێت بەطاغووت .

هەندێ کەس بەهەڵە تێگەیشتن وئەوانیان کردە طاغووت لەبەرئەوەی هەندێک لەهاوبەش دانەران بەندایەتییان بۆئەوان ئەکرد، هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : (اللهم لا تجعل قبري وثناً يعبد) رواه احمد ومالك، واتە:(پەروەردگارم گۆڕەکەم مەکە بەبتێک تاکو بپەرسترێ)

هەربۆیە ڕەنگە طاغووت لەبەندایەتی مرۆڤ بێت نەک بۆ پەرستراوەکان ئەم پێشبینییەش دوورە، چونکە لەڕاستیدا بەندایەتییەکە بۆ شەیطان بوو چونکە شەیطان خواوەند وپەرستراوی گشت هاوبەش دانەرێکە، هەروەک الله تەعالا دەفەرموویێت : (قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنْتَ وَلِيُّنَا مِنْ دُونِهِمْ ۖ بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُمْ بِهِمْ مُؤْمِنُونَ) (سبإ:٤١)واتە: فریشتەکان دەڵێن پاك و بێگەردی بۆ تۆ تەنیا تۆ گەورەی ئێمەی نەك ئەوان بەڵکو ئەوان جنۆکەیان دەپەرست زۆربەیان باوەڕیان بەوان (جنۆکە) هەبوو

(إِنْ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِنْ يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَرِيدًا) (سبإ:٤١)واتە: جگە لەخوا نزاو هاوار ناکەن(ناپەرستن جگە لەخوا) تەنها لە چەند(بتێکی ناو لێنراوی) مێینەیە نەبێت وە ناپەرستن جگە لە شەیتانی یاخی و سەرکەش نەبێ.

## بابەتی پێنجەم : دەستەواژە هاوواتاکانی کوفر بەطاغووت :

هەندێک دەستەواژەی شەرعی هاتووە لەکوفر بەطاغووت، لەوانە:

تەوحید، لا إله إلا الله، نەهی لەشیرك وهاوبەش دانان، کوفر بەوانەی لەبری الله ئەپەرسترێ، الإخلاص، تەنها الله پەرستی، ئیمان بە الله بەتەنها .

تەوحید هاوواتای کوفر بەطاغووتە:

شێخ عبدالرحمن کوڕی حەسەن لە "الفتح" دا دەڵێت: (تەوحید : بریتییە لەکوفر بەگشت طاغووتێک کە ئەپەرسترێ لەبری الله)

## بابەتی شەشەم : ووتەی زانایانی ئەهلی علم لەسەر پێناسەی طاغووت :

ئیمامی مالك دەڵێت : (طاغووت بریتییە لەهەرشتێک لەبری الله ئەپەرسترێ) تەفسیری ابن کثیر .

ابن جریر الطەبەری لەتەفسیرەکەی دەڵێت : (طاغووت بریتییە لەهەرشتێ سنووری الله ئەبەزێنێت، وبپەرسترێ لەبری الله، ئەگەر بەزاڵ بونی ئەوکەسەبێت کەئەیپەرستێ، یان بەگوێڕایەڵی ئەوکەسەی ئەیپەرستێ، ئەگەر ئەو پەرستراوە مرۆڤ بێت یان شەیطان یان بت یان هەرشتێک بێت، ووای دەبینم سەرچاوەی طاغووت، طغووت بێت وەکو دەڵێن: فلان کەس طوغای کردووە(زیادەڕەوی کردووە)، ئەگەر

پێگەی خۆی تێپەڕاند وسنووری خۆی بەزاند) هەروەها دەڵێت : (جبت وطاغووت دوو ناون بۆهەرشتێ زیاد لەسنووری خۆی دەرچووبێت لەبەندایەتی بۆ غەیری الله یان گوێڕایەڵی یان سەردانەواندن بۆی) .

ابن تيمية دەڵێت : (طاغوت لەطوغیانەوە هاتووە لەسەر وەزنی فعلوت، طوغیانیش لەسنوور دەرچوونە و زوڵم ودەستدرێژییە، چونکە پەرستراو لەبری الله ئەگەر ناچار نەکرابێت ئەوا طاغووتە، هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ ناوی بتەکانی هێنا بە طەواغیت، لەفەرموودەیەکی صەحیحدا : (ويتبع من يعبد الطواغيت طواغيت) واتە: (ئەوانەی طەواغیت دەپەرستن شوێنی طاغووت ئەکەون) وگوێڕایەڵی دەکەن لەسەرپێچی الله، هەروەها گوێڕایەڵی لەغەیری هیدایەت ودینی حەق جیاوازی نییە ئەگەر هەواڵە پێچەوانەکەی قورئان قبوڵبکات، یان تەنها گوێڕایەڵی بکات لەفەرمانی غەیری قورئان ئەوا طاغووتە، لەبەرئەمەش هەرکەسێ حوکم بگێڕێتەوە بۆ غەیری حوکمی کتێبی الله ئەوا بە طاغووت ناودەبرێ، هەروەها فیرعەون وعاد بەطاغووت ناویان هاتووە) . الفتاوى ٢٨/٢٠٠ .

هەروەها دەڵێت : (هەرشتێ گەورەبکەیت بەباتڵ لەبری الله تەعالا) بەیاننامەی تەلبیسی جەهمییەکان . ١/٤٥٠ .

ابن قيم دەڵێت : (طاغووت هەرشتێکە تێیدا بەندە لەسنوور دەربچێت لە پرستراو یان شوێنکەوتوو یان گوێڕایەڵ، کەواتە طاغووتی هەر گەلێک ئەوەیە کەحوکمی بۆ دەگەڕێننەوە لەبری الله وپێغەمبەرەکەی، یان لەبری الله ئەپەرسترێ یان شوێنی ئەکەون لەسەر غەیری ڕۆشنایی و بەڵگەیەك لەلایەن اللە، یان گوێڕایەڵی ئەکەن لەسەر شتێک کەنازانن ئەوە بەندایەتی الله یە، ئەمانە طەواغیتی جیهانن ئەگەر بیری لێبکەیتەوە وبیر لەحاڵی خەڵکی بکەیتەوە لەگەڵیدا ئەوا ئەبینی زۆربەیان

بەندایەتی الله یان گۆڕیوە بە بەندایەتی طاغووت، وحوکم گێڕانەوە بۆ الله وپێغەمبەرەکەیان گۆڕیوە بەحوکم گێڕانەوە بۆ طاغووت، وگوێڕایەڵی وشوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەیان گۆڕیوە بەگوێڕایەڵی طاغووت وشوێنکەوتنی) . إعلام الموقعين ١/٥٠ .

محەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب دەڵێت : (طاغووت گشتگیرە بۆهەرشتێ بپەرسترێ لەبری الله وڕازیبێت بەو بەندایەتییە جا پەرستن بێت یان شوێنکەوتوو یان گوێڕایەڵی بۆ بکرێ لەغەیری تاعەتی الله وپێغەمبەرەکەی) .

نەوەوی لە شەرحی موسلمدا دەڵێت : (ليث وابوعبيده وكەسائی وئەهلی زمانەوانی دەڵێن : (طاغووت بریتییە لەهەرشتێ لەبری الله بپەرسترێ) .

ابن الاثیر دەڵێت : (هەرشتێ بەندە سنووری پەروەردگاری پێ ببەزێنێت لەکوفر) . النهایه ٣٥٤ .

قورطوبی لەتەفسیرەکەی دەڵێت : (طاغووت کاهن وشەیطان وهەموو سەرگەورەیەکی گومڕاییە) .

عبدالله أبابطین دەڵێت : (طاغووت هەموو پەرستراوێکە لەبری الله، وهەموو سەرکردەیەکی گومڕایە کەبانگەواز دەکات بۆباتڵ وجوانی ئەکات، وگشت کەسێ ئەگرێتەوە کەخەڵکی دایانناوە وحوکمیان دەکات بەجاهیلیەت کەدژی حوکمی الله وپێغەمبەرەکەیەتی، وکاهن وجادووگەر وخزمەتکارانی بت وبانگخوازانی گۆڕپەرستی وهەتادووای، لەبەرئەوەی بەچیرۆکە گومڕاکەرە جاهیلەکان درۆ هەڵدەبەستن... وسەرچاوەی ئەم جۆرانەش گشتی یان زۆربەی : شەیطانە، چونکە ئەو طاغووتی گەورەیە) . الدرر ٢/١٠٣ .

الشنقیطی لەتەفسیرەکەیدا دەڵێت : (لەڕاستیدا هەرچی لەبری الله بپەرسترێ ئەوا طاغووتە وپشکی گەورەش تێیدا شەیطانە)

## حەوتەم : بەڵگەکان لەسەر کوفر بەطاغووت : لەهەشت شوێندا باسکراوە لەقورئاندا :

-الله تەعالا- دەفەرموویێت :(وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَى اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَىٰ) (الزمر:١٧)

جا ئەوانەی کە خۆیان دوورە پەرێز گرتووە لە هەموو ئەو شتانەی خەڵکی دەیپەرستن، جگە لە خوای پەروەردگار و بەتەوبە و پەشیمانیەوە گەڕاونەتەوە بۆ لای خوا، مژدەی سەرکەوتن و سەرفرازی و بەختەوەری و کامەرانی بۆ ئەوانەیە

(فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ) (البقرة:٢٥٦)

جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ تاغوت ـ (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە

(وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ) (النحل:٣٦)

سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێیان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر

(أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَٰؤُلَاءِ أَهْدَىٰ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا) (النساء:٥١)

ئایا نەتڕوانیوەتە ئەوانەی کە بەشێک لە کتێبی ئاسمانی پێدراوە (کەچی لەگەڵ ئەوەشدا) باوەڕیان بەفاڵچی و جادووگەرو بت و پەیکەرو شەیتان و ... هەیە و دەربارەی ئەوانەی کە بێ باوەڕن دەڵێن: ئەوانە چاکترن و ڕێبازی ڕاستتریان گرتووە، تا ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان (بەئاینی ئیسلام هێناوە).

(قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ بِشَرٍّ مِنْ ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِنْدَ اللَّهِ ۚ مَنْ لَعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ ۚ أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَكَانًا وَأَضَلُّ عَنْ سَوَاءِ السَّبِيلِ) (المائدة:٦٠)

ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە کردارێک کە تۆڵەکەی لای خوا خراپترە لە تۆڵەی لەکەدارکردنی موسڵمانان، ئەوەش کرداری ئەو کەسەیە کە خوا نەفرینی لێکردوە و جامی خەشم و ڕقی خۆی ڕژاندووە بەسەریداو هەندێکیشی کردن بە مەیموون و هەندێکیشیان بە بەراز و هەندێکیانیشی کردە تاغوت پەرست و بت پەرست؟! ئا ئەوانە خراپترین جێگە و ڕێگەیان هەیە و گومڕاترین کەسن لە ڕێبازی ڕاست و دروست

(اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ ۗ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ) (البقرة:٢٥٧)

خوا پشت و پەنا و خاوەنی ئەو کەسانەیە باوەڕیان هێناوە، لە تاریکاییەکانی (گومان و ستەم) دەریان دەهێنێت و دەیانبات بەرەو نوورو ڕووناکی، ئەوانەش کە ڕێبازی کوفریان گرتۆتەبەر، یارمەتی دەرەکانیان تەنها ـ تاغوتەکانە، لە نوورو ڕووناکی دەریان دەهێنن و بەرەو تاریکاییەکان دەیانبەن، ئا ئەوانە نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشە تیایدا دەمێننەوە

(أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا) (النساء:٦٠)

ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بەلای ئەوانەی وا خۆ نیشان دەدەن کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆتۆ(کە قورئانە) و بەوەش کە پێش تۆ دابەزیوە(کە تەوراتە) دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بە بەرنامەی خوا ناکات لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە بڕوایان پێی نەبێت وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گومڕایی یەکی دوور لە ڕاستی.

(الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ ۖ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا) (النساء:٧٦)

ئەوانەی ئیماندارن (تەنها) لە پێناوی خوادا دەجەنگن (بەڵام) ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی ستەمکارو زۆردار و (تاغوت)دا دەجەنگن، دە بجەنگن دژی یاوەرانی شەیتان (چونکە) بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پووچ و لاوازە

ئەم هەشت ئایەتە حەوت حوکمی بۆمان ڕونکردەوە لەمامەڵە کردن لەگەڵ طاغووت : واج بوونی کوفر بەطاغووت، دوورکەوتنەوە لێی، وکوفری ئەوکەسەی باوەڕی پێ بهێنێت، یان بیپەرستێ، یان حوکمی بۆ بگێڕێتەوە، یان دۆستایەتی بکات، یان لەپێناویدا کوشتار بکات .

ئاگەدارکردنەوە لەطوغیان ولۆمەی طاغووتەکان وپەیمان پێدانیان بەسزا، لەچەند ئایەتێکدا هاتووە لەوانە : (وَلَا تَطْغَوْا) (هود:١١٢) , (قَوْمٌ طَاغُونَ) (الطور:٣٢) , (طُغْيَانًا وَكُفْرًا) (المائدة:٦٨) , (لِلطَّاغِينَ مَآبًا) (النبإ:٢٢) , (اذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ) (النازعات:١٧) , (كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا) (الشمس:١١)

## بەڵگەکان لەسەر کوفر بەطاغووت لە سوونەت :

١- لە ئەبوهورەیرەوە -رضي الله عنه- دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت : (الله خەڵکی کۆدەکاتەوە لەڕۆژی قیامەت ودەفەرمووێت هەرکەسێ هەرشتێکی پەرستبێ ئەوا باشوێنی بکەوێت، ئەوانەی کەخۆریان دەپەرست شوێنی خۆر ئەکەون وئەوانەی مانگیان ئەپەرست شوێنی مانگ ئەکەون وئەوانەی طەواغیتیان ئەپەرست شوێنی طەواغیت ئەکەون وتەنها ئەم ئوممەتە دەمێنێتەوە) رواە البخاری .

ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی خۆر ومانگ بەطاغووت ناو نابرێت سەرەڕای ئەوەی خۆر ومانگیش پەرستراون، ئەمەش ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بێت کەخۆر ومانگ دوو ئایەت وبەڵگەی ئولوهیەتی - الله- ن وخەڵکی ئەیانپەرست بەبێ ڕازەمەندی خۆر ومانگ، ئەگەر خۆر مانگیش بەطاغووت ناو ببرایا ئەوا سۆزی طاغووتەکان لەسەریان سۆزی گشتی لەسەر تایبەتی دەبوو .

٢-لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ثەورەوە دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت : (سوێند مەخۆن بەباوک وباپیرانتان وهەروەها بەطەواغییەکان) . موسلم ڕیواتی کردووە وهەروەها لەڕیواتی احمد دا هاتووە (بە طەواغیتەکان) .

٣-پێغەمبەر (ﷺ) بەوکەسەی فەرموو کە نەزری کردبوو سەری خۆی ببڕێت : (ئایا بت یان طاغووتی تێدابوو؟ ووتی: نەخێر، فەرمووی: ئۆف لەو نەزرەی تۆ) رواه احمد .

٤-پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە عثمانی کوڕی ئەبولعاص : کەمزگەوتی طائیف کە طاغووتەکانی تێدابوو، کە ئەمڕۆ لەشوێنەکەیدا مزگەوتی -ئیبن عباس-ە . رواه ابو داود .

٥-پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کرد وڕیگەی نەدا بەوەفدی ثەقیف بۆئەوەی بتی(للات) بهێڵنەوە بۆماوەی یەک مانگ، ئیبن قیم دەربارەی ئەو حوکمە دەڵێت : (جائیز نییە شوێنگەی شیرک وطەواغیت بمێنێتەوە لەدووای هەبوونی توانا بەسەر ڕوخاندنیدا ئەگەرچی یەک ڕۆژیش بێت چونکە ئەوە درووشمی شیرک وهاوبەش دانەرییە . الزاد ٢/٢٠٠ .

٦- جابر دەڵێت : ئەو طاغووتانەی کە حوکم ئەگێڕایەوە بۆلایان لە -جهینة واحد- و -أسلم واحد و -کل حي واحد- ئەوانە کاهن وشەیطانیان بۆ دادەبەزێت .

٧- عمر دەڵێت : (جبت) جادووگەرییە و (طاغووت) شەیطانە .

٨- عائیشە لەئایەتی صەفا ومەڕوەدا دەڵێت : ئەو ئایەتە دابەزیوە دەربارەی هەندێک ئەنسار کەپێش ئەوەی ببنە ئیسلام بتی (مناة)ی طاغووتیان دەکردە خواوەند .

هەموو ئەوانەی پێشوو لەصەحیحی بوخاری هاتووە .

سەعیدی کوڕی موسیب دەڵێت : ئەو ڕوبارەی کە گەوهەرەکانی قەدەغەدەکات بەڕووی طاغووتەکان وپیسی تیانەبوو وڕوون بوو ئەوا بۆ خواوەندەکەیان ئەیانبرد، ومەڕی تازەیان سەردەبڕی بۆطاغووتەکانیان .

٩- عەلی کوڕی ئەبوطالب -رضي الله عنه- دەڵێت : (من وپێغەمبەر (ﷺ) دەرچووین هەتا گەیشتینە کەعبە، پێغەمبەر (ﷺ) پێمی فەرموو دانیشە وسەرکەوتە سەرشانم ویستم بەرزی بکەمەوە بینی کە هێزی ئەوم نەبوو ئینجا دابەزی وپێغەمبەر (ﷺ) دانیشت بۆم، پێی فەرمووم سەرکەوە بۆسەرشانم، ووتی: منیش چوومە سەرشانی، ووتی: بەرزی کردمەوە هەتا واهەستم کرد ئەگەر بمویێت ئەمگەیەنێتە بەرزایی ئاسمان، هەتا چوومە سەر ماڵی کەعبە کەبینیم پەیکەرێکی زەرد یان مسی لێبوو پاشان ڕامدەکێشا جارێک بەلای ڕاست وجارێک بەلای چەپ وجارێک لەپێشەوە وجارێک لەدوواوە هەتا دەستم پێی گەیشت پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم فڕێی بدە خوارەوە منیش فڕێمداوە خوارەوە وشکاندم وەکو شووشە شکا، پاشان دابەزیم ومن وپێغەمبەر

(ﷺ) هەڵهاتین هەتا لەماڵەکاندا خۆمان شاردەوە نەوەک کەسێک بمانبینێت) . رواه الامام احمد وبو يعلى والبزار بسند حسن .

و (الهيثمي) بەشێکی بۆی تەرخان کرد لە -مجمع الزوائد : (بەشی شاکندی بتەکان لەلایەن پێغەمبەر (ﷺ) وڕیوایەتێکی هێنایەوە : (لەسەربانی کەعبە کۆمەڵێ بت هەبوو ڕۆشتم بۆئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بەرزبکەمەوە نەمتوانی پاشان ئەو بەرزی کردمەوە پاشان پارچە پارچەم کرد) لەڕیوایەتێکی تردا بۆی زیادکرد: (لەدووای ئەوەوە بتیان نەخستە ئەوشوێنە، واتە شتێک لەو بتانە) .

الهيثمي دەڵێت سەرجەم پیاوەکانی جێی متمانەن طەبەریش ڕیواتی کردووە لە -تهذيب الآثار لاپەڕە ٢٣٦ .

١٠- پێغەمبەر (ﷺ) بەعەمرو کوڕی عەبسەی فەرموو بوو هەروەک خۆی دەڵێت : (ناردمی بۆئەوەی بتەکان بشکێنم) رواه مسلم .

فیقهێک لەم فەرموودەیەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەویش ئەوەیە کە کوفر بەطاغووت نابێ دوابخرێ.

١١- پێغەمبەر (ﷺ) لەڕۆژی فەتح هاتە ناو مەککەوە کە لەدەوروبەری ماڵی مەککەدا سێ سەد وشەست بت هەبوو ئینجا پیای ئەکێشا بەدارێک وئەیفەرموو: (حەق هات وباتڵ تووایەوە) . رواه البخاري .

بتەکانی شکاند لەدووای ئەوەی الله سەریخست بەسەر هاوبەش دانەرەکان وهیچ پەیکەر وبت وگۆڕێکی نەهێشتەوە ئیلا کەسێکی بۆلابردنی ئەنارد ودەستە دەستەی ئەنارد بۆشکاندنی بتەکان، بەڵکو مۆڵەتی نەدا بەهێشتنەوەی بتی (للات) وڕێگەی نەدا یەک مانگیش بمێنێتەوە کاتێک ثقيف داوایان لێی کرد وداواکەیانی ڕەتکردەوە وشوێنی میللەتی ئیبراهیم کەوت لەشکاندنی بتەکان .

١٢- ڕەفتاری پێغەمبەر (ﷺ) :

پێغەمبەر (ﷺ) شوێنکەوتەی ئیبراهیم بوو لەسەر میللەتی ئەو وهیدایەتی ئەو دەڕۆیشت هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بۆچرکەیەکیش ئاگربەستی لەگەڵ کافرەکان نەکرد وبێدەنگ نەبوو لەسەر باتڵەکەیان، بەڵکو خەم بیروهۆشی ئەو بەدرێژایی ژیانی لەپێش هیجرەت ودووای هیجرەتی ئەوەبوو، بگرە یەکەم شت بانگهێشتی بۆکرد ئەوەبوو کە الله بپەرستن ودووربکەونەوە لەطاغووت، چەند بەڵگەیەک شایەتن لەسەر ئەوە لەوانە فەرموودەی الله -عز وجل- کە دەفەرموویێت : ( وَإِذَا رَآكَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا الَّذِي يَذْكُرُ آلِهَتَكُمْ وَهُمْ بِذِكْرِ الرَّحْمَٰنِ هُمْ كَافِرُونَ)(الأنبياء:٣٦) واتە: وە کاتێ تۆ محەممەد(صلى الله عليه وسلم)) دەبینن ئەوانەی بێ باوەڕ بوون جگە لە گاڵتەو لاقرتی کردن بە تۆ هیچی تر ناکەن (بەسەر سامیەکەوە دەڵێن) ئا ئەمە

ئەو کەسەیە (بە خراپی) باسی بتەکانتان دەکات لە کاتێکدا خۆیان بەباسی (بە قورئانی) خوای میهرەبان بێ بڕوان
هەروەها وەسفی فریشتەکان بەڕاستی هاتەنەدی تێیدا هەروەک لەبوخاریدا هاتووە : (کە [پێغەمبەر (ﷺ)] خەڵکی جیاکردووەتەوە) .

١٣- جیهاد شەرعێکە لەبابەتی کوفر بەطاغووت، الله تەعالا دەفەرموویێت : ( وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ) (الأنفال:٣٩)
واتە: باوەڕداران جەنگ بکەن لەگەڵ بێ باوەڕاندا هەتا ئاژاوە(بێ باوەڕی و بت پەرستی) نامێنێت و ئایین و ملکەچی هەمووی بۆ خوا دەبێت جا ئەگەر کۆتایی یان هێنا ئەوە بەڕاستی خوا بە هەر کردەوەیەك کە (بێ باوەڕان) دەیکەن بینایە

١٤- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویێت : (هەرکەسێک گەیشت بەدەججال ئەوا با تف بکاتە دەموچاوی) . رواه ابو داود .

ئەوەش لەبابەتی کوفر بەطاغووتە .

١٥- عومەر -رضي الله عنه- درەختی (بیعة رضوان)ی بڕییەوە بۆداخستنی ڕێگاکانی شیرک وهاوبەش دانان .

١٦- لە عروەوە کەپرسیاری کرد لەعبداللە بن عمرو : چیت بینیوە پێغەمبەر (ﷺ) لەهەمووی زیاتر قوڕەیشی پێکابێ لەوکاتەی کە بەئاشکرا بانگەوازی دەکرد؟ ووتی: ڕۆژێکیان لەکۆبوونەوەی سەرگەورەکانیان ئامادەبووم لەلای کەعبە، باسی پێغەمبەریان کرد (ﷺ)، ووتیان: هەرگیز شتی وامان نەدیوە ئەوەندەی ئێمە ئارامان گرتووە لەسەر ئەو پیاوە کەئاواتەکانمانی پووچەڵ کردەوە وسووکایەتی بە باوباپیرانمان ئەکات ودینەکەمان عەیبدار دەکات وکۆمەڵەکەمان بەش بەش دەکات وجنێوی بەخواوەندەکەمان دا، ئێمە لەسەر شتێکی گەورە ئارامان لەسەری گرتووە، هەروەک ووتیان، دەڵێت: لەو کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) بەدیارکەوت، هاتەپێشەوە هەتا دەستی گرت بە ڕوکن وپاشان طەوافی دەکرد بەدەوری کەعبەدا لەنێوان ئەوان لەوکاتەشدا ئەوان سوکایەتییان بەهەندێک لەووتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد، دەڵێت: لەڕوخساریدا هەستم پێکرد، پاشان تێپەڕی وبۆ طەوافی دووەم گەڕایەوە بەهەمان شێوە سوکایەتییان پێکرد،دەڵێت: لەڕوخساریدا هەستم پێکرد، پاشان تێپەڕی وبۆ جاری سێیەم طەوافی کرد بەهەمان شێوە سوکایەتییان پێکرد، فەرمووی: (گوێگرن ئەی کۆمەڵی قوڕەیش، سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، من بۆسەربڕینتان هاتووم) ئەو ووشەیە لەمێشکی گەلەکە مایەوە هەتا هیچ پیاوێکیان نەمایەوە ئیلا وامدەزانی باڵندەیەک لەسەر سەریدا نیشتووەتەوە هەتا توونڕەوترینیان بەنەرم

ترین ووشە وەڵامی دایەوە هەتا ئەیووت: ئەی ئەبولقاسم فەرموو تێپەڕبە، بەگەورەییەوە تێپەڕبە، -سوێند بە الله- تۆ نەزان نەبوویت، پێغەمبەر (ﷺ) تێپەڕیوو، هەتا سبەی بەیانی هاتەوە، لەلای کەعبەدا کۆببونەوە ومنیش لەناویان بووم، هەندێکیان بەهەندێکیان ووت: بیرتان دێت چیتان لێکرد وچی لێکردن، هەتا ئەو دەستپێشخەری کرد بەوشتەی کەپێتان ناخۆشە پاشان دەستبەرداری بوون، لەکاتێکدا ئەوان وابوون پێغەمبەر (ﷺ) بەدەرکەوت هەموویان بەیەکەوە وەکو یەک پیاو هەستانە سەرپێ ودەوریان دا، ووتیان: تۆ ئەوکەسە بووی کەئەوها وئەوهات ووتووە، کاتێک خواوەندەکانیان ودینەکەیانی عەیبدار دەکرد، دەڵێت: پێغەمبەریش (ﷺ) ئەیفەرموو: بەڵێ، من وام دەووت، دەڵێت: پیاوێک هەستایەوە وجلەکانی کۆکردەوە دەڵێت: ابوبکر الصدیق -رضي الله عنه- هەستایەوە وبەگریانەوە ووتی: (ئایا پیاوێک ئەکوژن لەبەرئەوەی دەڵێت الله پەروەردگاری منە). پاشان ڕۆشتن بەڕاستی ئەوە سەختترین شت بوو بەسەر قوڕەیشدا هاتبێت . رواه احمد .

## بابەتی هەشتەم : ووتەی ئەهلی علم سەبارەت بەئەم بابەتە :

محمدی کوڕی عەبدولوەهاب دەڵێت: (دینی ئیسلام درووست نابێت ئیلا بە بەرائەت کردن لەئەوانە -واتە طاغووتە پەرستراوەکان لەبری الله- وتەکفیر کردنیان) الدرر ١٩/٥٣ .

هەروەها دەڵێت: (یەکەم شت الله فەرزی کردووە لەسەر ئادەمیزاد کوفرکردن بەطاغووت وباوەڕهێنان بە الله یە، بەڵگە (وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ) (النحل:٣٦) واتە: سوێند بە خوا لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خوا بپەرستن و دوورکەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر

لەکیتابی تەوحیددا دەڵێت: {ئەمە گەورەترین شتە کە واتای لا إله إلا الله ڕووندەکاتەوە، چونکە تەنها ووتنەوەی ئەم ووشەیە نابێتە مایەی پاراستنی خوێن وماڵ، هەروەها زانینی واتاکەیشی نابێت، خوێن وماڵی ناپارێزرێ هەتا لەسەرووی ئەوانەیشەوە کوفر دەکات بەهەموو پەرستراوێک جگە لە الله، چونکە ئەگەر گومان یان دوودڵی لا دروستبێت ئەوا خوێنی حەرام نابێت) .

هەروەها دەڵێت: (بابەتە گەورەکە : بەندایەتی الله درووست نابێت هەتا کوفر نەکات بەطاغووت) .

ئیبن قەییم دەڵێت : (جائیز نیە شوێنەکانی شرك وطاغووت بمێنێتەوە لەدووای هەبوونی توانا بەسەر ڕوخاندنیدا وبەتاڵکردنەوەی بۆ یەک ڕۆژ چونکە ئەوانە درووشمی شرك وکوفرن کەگەورەترین مونکەرن هەڵبەتە جائیز نییە ئیقرار بکرێت لەسەری لەکاتێکدا توانا هەبێت بەسەر ڕوخاندنیدا، هەربەم جۆرەش حوکم درا بەسەر

ڕازاندەوەی گۆڕەکان کەدواتر کرانە بت وطەواغیت ولەبری الله ئەپەرستران، هەروەها ئەو بەردانەی کە بەمەبەستی گەورەکردن وپیرۆزکردن ونەزر وماچکردن بەکاردەهێنرێن ئەوا نابێت یەک شتێکیان لێ بمێنێتەوە لەسەر زەویدا لەگەڵ هەبوونی توانا بەسەر لەناوبردنیدا وزۆربەی ئەوانەش هاوشانی بتی "للات" و"عوزا" و"مەنات" ن بەڵکو شرکەکەیان گەورەتریشە لەوانە) زاد المعاد ٢/٢٠٠ .

ودەڵێت: ئەمانە طەواغیتی جیهانن ئەگەر سەرنجی بدەیت وسەرنجی حاڵی خەڵکیش بدەیت لەگەڵیدا ئەبینیت کەزۆربەیان لەوانەن کەدژایەتی بەندایەتی الله دەکەن وبەرەو بەندایەتی طەواغیت هەنگاو ئەنەن، ولەتاعەتی الله وشوێنکەوتنی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆتاعەت وشوێنکەوتنی طەواغیت) سلیمان بن عبدالله تیسیر العزیز لێوەی نەقڵ کردووە ٣٣ .

هەروەها سلیمان بن عبدالله دەڵێت: (لەبەرئەوەی واتای تەوحید وشایەتمان بە لا إله إلا الله ئەوەیە کەهیچ ناپەرسترێ لەبری الله وپێویستە بیروباوەڕ وابێت سوود وزیان ناگەیەندرێ ئیلا لەلایەن الله، وکوفر دەکرێ بەهەرشتێ بپەرسترێ لەبری الله وتەبەرەئیان لێ دەکرێ وهەروەها لەبەندەکانی طاغووت) التیسیر ١٥٢ .

عەبدولڕەحمانی کوڕی حەسەن دەڵێت: (تەوحید بریتیە لەکوفر بەگشت طاغووتێک کەدەپەرسترێن لەبری الله... وکوفر بەطاغووت تاکە ڕوکنێکە هەروەک لەسورەتی (البقرة) هاتووە، وتەوحید بنچینەی ئیمانە کەهەچ کردەوەیەک وەرناگیرێت بەبێ ئەوە وبەنەبوونی ئیمان پووچەڵ دەبێتەوە)فتح المجید ٣٩٣ .

هەروەها دەڵێت: (گێڕاناوەی حوکم بۆلای طاغووت بریتییە لەبەندایەتی بۆی).

ودەڵێت: (ئەو ئایەتە بەڵگەیە کەهیچ بەندەیەک دەستگرتوو نابێ بە لا إله إلا الله هەتا کوفر بەطاغووت دەکات، کەئەویش دەستگرتنە بەپەتی (عروة الوثقى) کەپچڕانی نییە، هەرکەسێکیش عەقیدە وبیروباوەڕی وانەبێت ئەوا موسڵمان نییە، چونکە دەستی نەگرتووە بە لا إله إلا الله، دەسا سەرنج بدە وعەقیدەت وابێت کەبتپارێزێ لەسزای الله کەئەویش هێنانەدی واتای لا إله إلا الله یە بەنەفی وئیثبات) الدرر ١١/٢٦٣ .

ئیبن سەحمان دەڵێت: (الله تەعالا ڕوونیکردەوە کەخۆگرتوو بە (عروة الوثقى) ئەوەیە کە کوفر دەکات بەطاغووت، وکوفر کردن بەطاغووتی کردە پێش ئیمان بە الله، چونکە ڕەنگە کەسێک بڵێ ئیمانم هەیە بە الله لەکاتێکدا دوورناکەوێتەوە لەطاغووت لێرەدا قسەکەی بەدرۆ دەخرێتەوە، وهەواڵی پێداین کەسەرجەم پێغەمبەران ڕەوانەکراون بۆدوورکەوتنەوە لەطاغووت، چونکە هەرکەسێ خۆی لێ دوورنەکاتەوە ئەوا پێچەوانەی سەرجەم پێغەمبەرانە) الدرر ١٠/٥٠٢ .

لەدووای ئەوەش دەڵێت: (داواکراو لەدوورکەوتنەوە لەطاغووت : ڕق لێبوونەوەی ودژایەتیکردن وسوکایەتی پێکردنی وناشرینکردنی بەزمان ولابردنی بەدەست ئەگەر لەتواناادا هەبێت بەسەریدا وجیابوونەوە لێیەوە، چونکە هەرکەسێ بڵێ دوورکەوتومەتە لەطاغووت بەڵام بەکردەوە ئەنجامی نەدات ئەوا ڕاستگۆ نەبووە)

## بابەتی نۆیەم : کوفر بەطاغووت یەکەم شتە الله فەرزی کردووە وپێغەمبەرەکان کۆکراونەتەوە لەپێناویدا :

یەکەم شت الله فەرزی کردووە لەسەر بەندەکانی کوفر بەطاغووتە، ولەبەرئەمەش سەرجەم پێغەمبەران بانگەوازیان کردووە وپێغەمبەران کۆدەنگ بوون لەسەر ئەوەی دین قبوڵناکرێت ئیلا بەوە، هەروەک فەرموودەی الله بووە بەڵگە لەسەرئەوە کەدەفەرموویێت : (وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ) (النحل:٣٦) واتە: سوێند بە خوا لەناو هەموو گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خوا بپەرستن و دوورکەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر.

## بابەتی دەیەم : حوکمی کوفر بەطاغووت ولەبەرئەوەی مەرجە بۆدروستی تەوحید وئیمان وئیسلام درووست نابێت ئیلا بەئەوە وئەوەش یەکەم شتە الله فەرزی کردووە :

کوفر بەطاغووت ڕوکنێکی گەورەیە لەتەوحیددا کەواتە تەوحید پێی ناوترێ تەوحید ئەگەر نەفی تێدا نەیەتی دی کەئەویش بریتییە لەکوفر بەطاغووت، ولەبەرئەوەی تەوحید بەبێ ئەو نایەتەدی ئەوا درووست نابێت وئیسلام قبوڵناکرێت ئیلا بەئەو، دەقەکانیش بوونە بەڵگە لەسەر ئەو بنەمایە وئەهلی عیلم بەکۆدەنگ قسەیان لەسەرئەمە کردووە، چونکە کوفر بەطاغووت ونەفی وئیثبات لەتەوحیددا بەیەکەوەن ولەیەک جیاناکرێنەوە، ودواخستنی کات نابێت لەنێوانیاندا بەڵکو پێویستە لەیەک کاتدا بێنەدی وئەمەش پێویستە، چونکە بەندایەتی بۆ الله نابێت ئیلا بەکوفرکردن بەبەندایەتی غەیری ئەو چونکە گشت فەرمانێک بەبەندایەتی الله مەبەست تێدا تەوحیدە . (لا إله إلا الله)

الله (ﷻ) دەفەرموویێت: (فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ) (البقرة:٢٥٦) واتە: جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ تاغوت ـ (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە.

عروة الوثقی : بریتییە لەووشەی تەوحید وئیمان وئیسلام، وواتای ئایەتەکەش هەرکەسێ کوفر بەطاغووت نەکات ئەوا دەستی نەگرتووە بە "عروة الوثقی"وە وتەوحیدی نەهێناوە، کەواتە کافرە وموسڵمان نییە.

لێرەشەوە هەرکەسێ کوفر بەطاغووت نەکات ئەوا کافر وهاوبەش پەیداکەرە، ولەم ڕووەوە کوفر بەطاغووت ڕوکنی تەوحیدە وقبوڵناکرێت ودرووست نابێت ئیلا پێی، چونکە تەوحید دەبێت لەسەر بەندایەتی بۆ الله لەگەڵ کوفر بەشرك، وهەرکەسێ الله نەپەرستێ کافرە وهەرکەسێ کوفر نەکات بەئەوانەی تر ئەوا موشرك وهاوبەش پەیداکەرە

**یازدەهەم : حوکمی ئەوانەی دەڵێن (لا إله إلا الله) بەڵام کوفر بەطاغووت ناکەن:**

هەرکەسێ بڵێت : (لا إله إلا الله) بەڵام کوفر نەکات بەطاغووت ئەوا کافرە وموسڵمان نییە.

**بابەتی : ئایا درووستە بەندە ئیمان بێنێ بە الله لەگەڵ ئەوەشدا کوفر بەطاغووت نەکات ؟**

وەڵام : ڕەنگە کوفرنەکردن بەطاغووت کۆببێتەوە لەگەڵ ئیمان بە -پەروەردگارێتی(ڕبوبیەتی)- الله، هەروەک شرك لەگەڵ ئیمان کۆدەبێتەوە لە ڕبوبیەتی الله، الله تەعالی ڕاستی فەرمووە:

( وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُمْ بِاللَّهِ إِلَّا وَهُمْ مُشْرِكُونَ)(یوسف:١٠٦) واتە: جا زۆربەیان باوەڕ ناهێنن بە خوا مەگەر ئەوان لەوکاتەدا هاوبەش بڕیار دەرن بۆ خوا.

هەروەک پێشینانمان تەفسیری بۆئەکەن، ئیمانی ڕاست ودرووست بە الله وتەوحیدی ڕاستەقینە نابێت ئیلا بەئیمان هێنان بەتەوحیدی ئولوهیەت وڕبوبیەت بەیەکەوە، ئەمما ئەم فەرموودەیەش : (هەرکەسێ بڵێت لاإله إلا الله وکوفر بکات بەهەموو ئەوانەی لەبری الله ئەپەرسترێن ئەوا خوێن وماڵی حەرام دەکرێت ولێپرسینەوەی لای الله دەبێت) رواه مسلم . ئەم (عطف)ە بۆ دووپێتکردنەوە (تأكيد) نەک شتی تر، لەبەر ئەوەی کوفرکردن بەئەوانەی لەبری الله ئەپەرسترێن یەکێکە لەواتاکانی تەوحید.

شێخ محمدی کوڕی عەبدولوەهاب دەڵێت : (کاتێک دەفەرموویێت : کوفربکات بەئەوانەی لەبری الله ئەپەرسترێن ئەوا دووپاتکردنەوەی نەرێ (تأكيد النفي)، چونکە خوێن وماڵ پارێزراو نابن ئیلا بەئەوە، وە ئەگەر گومانی هەبێت یان دوودڵبێت ئەوا خوێن وماڵی پارێزراو نابێت، وچاک بزانن مرۆڤ ئیمان ناهێنێ بە

الله هەتا کوفر نەکات بەطاغووت بەڵگەش فەرموودەی الله  تەعالایە(فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى )(البقرة:٢٥٦) واتە: جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ تاغوت ـ (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە

( الرشد) واتا دینی موحەممەد (ﷺ)، و (الغي) دینی ئەبو جەهلە، و (عروة الوثقى) شایەتمانی لا إله إلا الله یە، کەئەویش نەفی وئیثبات(ئەرێ ونەرێ) دەگرێتە خۆی، ڕەتکردنەوەی سەرجەم بەندایەتیەکان بۆغەیری الله، وجێگیرکردنی سەرجەم بەندایەتیەکان بۆ الله تەعالا بەتەنها وبەبێ هاوبەش وشەریک) مجموعة التوحيد.

هەروەها دەڵێت : دینی پێغەمبەر (ﷺ) تەوحیدە، کەئەویش ناسینی لا إله إلا الله محمد رسول الله یە، وکارکردن بەداواکاریەکانی، ئەگەر ووترا : سەرجەم خەڵکی بەزمان ئەیڵێنەوە، دەڵێین : تێیان هەیە ئەیڵێتەوە ووادەزانێت واتاکەی ئەوەیە کەهیچ کەسێ ناتوانێ بەدی بهێنێت جگە لە الله، یان کەس ڕزق نادات جگە لە الله یان لەوجۆرە، خەڵکیش هەیە واتاکەی تێ ناگات، خەڵکیش هەیە داواکاروەکانی جێبەجێ ناکات، وخەڵکیش هەیە ئەقڵی ڕاستەقینەکەی وەرناگیرێت، لەئەوانەش سەیرتر کەسێک ڕاستەقینەکەی بناسێت بەڕوویەکی، وبەڕووەکەی تریشی دژایەتی ئەو وئەهلەکەی بکات، ولەئەویش سەیرتر کەسێکە خۆشی بووێت وببێتە ئەندامێک لەئەهلەکەی بەڵام جیاوازی نەکات لەنێوان دۆستەکانی ودوژمنەکانی، سبحان الله العظيم! ئایا دەبێت دوو لایەنی دین جیاواز یەکبن وهەردووکیان لەسەر حەق بن؟ نەخێر بە الله، جا چی لەدووای حەقە جگە لەگومڕایی) الرسائل الشخصية ١٨٢ .

## دوازدەهەم : ئیمان بە الله کۆنابێتەوە لەگەڵ ئیمان بەطاغووت وکوفرنەکردن پێی :

ئیمان بە الله کۆنابێتەوە لەگەڵ ئیمان بەطاغووت، هەروەها بەندایەتی بۆ الله کۆنابێتەوە لەگەڵ بەندایەتی بۆطاغووت تەوحید کۆنابێتەوە لەگەڵ شرك پاشان یان بەندایەتی بۆ الله یان بۆطاغووت، چونکە ئەگەر ئیمان بهێنێت بەیەکێکیان ئەوا کوفر دەکات بەئەوی تر، لەبەرئەوەی پەروەدگار -عز وجل- خۆی پەرستراوی حەقە پێویستە ئیمانی پێ بهێنرێ، یەکێک لەنیشانەکانی ئیمان کوفرکردنە بەهەموو پەرستراوێک جگە لە الله، وهەرکەسێ ئیمان بهێنێت بە پەرستراوێکی تر جگە لە الله ودانبنێ بەطاغووت وئیمانی پێ بهێنێ ئەوا کوفری ئەنجام داوە بەدڵنیایەوە، بەڵکو هەرچەندە ئیمان نەهێنێت بەطاغووت بەڵام کوفری پێ نەکات ئەوا بەکافر هەژمار دەکرێت وئیمانی بە الله نییە.

ئیبن تەیمییە دەڵێت : (ئەمما ئەوەی بەندایەتی بۆ الله تەرک بدات فەرمانەکانی جێبەجێ نەکات وشوێنی هەواو ئارەزووی خۆی بکەوێت ئەوا الله ناپەرستێ بەڵکو شەیطان وطاغووت ئەپەرستێ). الفتاوى ١٦/٥٦٥ .

شێخ عەبدوللەطیف دەڵێت : هەرکەسێ هاوبەش دابدات ئەوا تەوحیدی تەرک داوە چونکە ئەودووانە دژی یەکن ویەک ناگرنەوە وجوودان لەیەکتری کۆناکرێنەوە) منهاج التأسيس لاپەڕە٦ .

بنەمای : کوفر بەطاغووت بەرامبەری ئیمان بە الله وبەندایەتی بۆ الله یە :

الله -عز وجل- سەلماندی کەهەیە ئیمان بەطاغووت دەهێنێت کاتێک دەفەرمووێت : (يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ) (النساء:٥١) واتە: باوەڕیان بەفاڵچی و جادووگەرو بت و پەیکەرو شەیتان و ... هەیە وئیماندار دژی کافرە هەرکەسێ ئیمان بهێنێ بەطاغووت ئەوا کوفری پێ نەکردووە وهەرکەسێ کوفری پێ بکات ئەوا ئیمانی پێی نییە

## بابەتی سیازدەهەم : پێگەی کوفر بەطاغووت لە (لا إله إلا الله)

یەکەم : پەیوەندی کوفر بەطاغووت بەڕوکنەکانی لا إله إلا الله:

کوفر بەطاغووت ڕوکنێکە لەڕوکنەکانی لا إله إلا الله کەبریتییە لە ڕوکنی نەفی (نەرێ) تێیدا لەبڕگەی (لا إله) : لا إله واتە کوفر بەطاغووت، وکوفر بەطاغووت ڕوکنێکی تەوحیدە کەڕوکنی نەفی یە تێیدا کەخۆی دەگرێتەوە لە (لا إله) کە واتاکەی نەفی ئولوهیەت بەسەرجەم تاک وتایبەتمەندییەکانی هەر لە حوکم ونوسک ونزیکبوونەوە ودوعا وبەشەرعی کردن وخۆشەویستی ودۆستایەتی وهەتا دووای لەسەر هەمووشتێک جگە لە الله -عز وجل. -

دووەم : کوفر بەطاغووت دەچێتە ناو مەرجەکانی لا إله إلا الله وپەیوەندییەکانی پێیەوە:

یەک : لەلایەنی خۆشەویستی الله وڕق لێ بوونەوەی طاغووت ودژایەتی کردنی.

دوو : لەلایەنی دڵسۆزی دروستبوو لەسەر تەوحید ونەفی ئولوهیەتە باتڵەکان.

سێ : لەلایەنی پابەندبوون.

دژەکانی ئەوانەش بە هەڵوەشێنەرەوەکانی (لا إله إلا الله) هەژمار دادەنرێت وڕوکن ومەرجەکانی دەڕووخێنێت.

## سێیەم : پەیوەندی کوفر بەطاغووت بە هەڵوەشێنەرەوەکان:

-پەیوەستە بە شرکەوە بەگشتی لەلایەنی بەندایەتی بۆطاغووت ووڕازی بوون پێی ئەمەش شرك وهاوبەشی دانانە.

-پەیوەستە بە هەڵوەشێنەرەوەی وازهێنان لەتەکفیری هاوبەش پەیداکەرەکان وبەڕاست دانانی ڕێبازەکەیان چونکە ئەوەی تەکفیری هاوبەش پەیداکەرەکان نەکات ئەوا کوفری نەکردووە بەطاغووت.

-پەیوەستە بەدۆستایەتی کافرەکان وسەرخستنیان کەئەمەش یەکێکە لەگەورەترین شێوازەکانی ئیمان بەطاغووت وکوفر نەکردن پێی وبەرائەت کردن لێی.

بەگشتی کوفرنەکردن بەطاغووت یەکێکە لە هەڵوەشێنەرەوەکانی (لا إله إلا الله)

## بابەتی چواردەهەم : گرنگی کوفر بەطاغووت وپێگەی لەدین وئیماندا :

بزانە کوفر بەطاغووت ڕوکنە گەورەکەی تەوحیدە وبەجۆرێک تەوحید پێی ناوترێ تەوحید ئەگەر نەفی تێدا نەیەتەدی کەئەویش کوفرە بەطاغووت، ولەبەرئەوەی تەوحید بەبێ ئەو نایەتەدی، ئەوا دین ڕاست نابێت وئیسلام وەرناگیرێت ئیلا بە ئەو، وزانایان نووسیویانە لەسەر ئەم بنەمایە وکۆدەنگیان لەسەری کۆکردووەتەوە.

الله سوبحانە وتەعالا دەفەرموویت : (فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ ) (البقرة:٢٥٦) واتە: واتە: جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ تاغوت ـ (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە (عروة الوثقی) شایەتمانی (لا إله إلا الله )یە، ووتای ئایەتەکەش هەرکەسێ کوفر بەطاغووت نەکات ئەوا دەستی نەگرتووە بە لا إله إلا الله.

ئەمەش ڕاستەقینەی میللەتی ئیبراهیمە، چونکە ئەوە لەسەر کوفر بەطاغووت بونیاتنراوە، هەروەها لەسەر دەستپێشخەری لەدوژمنایەتی ودووبەرەکی ئاشکراکردنی، و -الله- کردیە تاکەڕێگا بۆئەهلی ئیمان، هەرکەسێ پێی ڕازی نەبێ ئەوا هیچ نییە جگە لە کافرێکی پڕوپووچ.

کەواتە کوفر بەطاغووت بنچینەی بنچینەکانە، وگەورەترین ڕوکنە لەئیسلامدا، وسەرجەم پێغەمبەران بەئەوە هاتوونە، کەئەویش بەتاک دانانی الله یە -عز وجل- لەبەندایەتی لەسەرجەم لایەن ولقەکانیدا، کەواتە ئیمان درووست نابێت وهیچ کردەوەیەک وەرناگیرێت بەبێ ئەوە، وهەرئەویش یەکەم ئەرک و واجبە، ئەوە ئامانجی بەدیهێنانی بەدیهێنراوەکانە کەپێغەمبەریان بۆ ڕەوانەکراوە وکتێبیان بۆ دابەزیوە، وبنچینەی بەدیهێنراوەکانیش لەسەر ئەمەیە، وبەئەمەش وەلاء وبەراء دەبەسترێ، ولەپێناو ئەمەشدا جیهاد شەرعی کراوە وشمشێر هەڵکێشراوە وخوێن ڕژاوە، بەئەمەش ڕزگارمان دەبێت لەدونیا وئاخیرەت، وخوێن ناپارێزرێ ئیلا لەدووای کوفر بەهەر پەرستراوێک جگە لە الله جاهەرجۆرە پەرستراوێک بێت وهەر تایبەتمەندیەکی هەبێت وهەر بارودۆخێکی هەبێت، یان هەرجۆرە بەندایەتیەکی بۆ ئەنجام بدرێت،

ویەکێک لەبەڵگە ڕوونەکان بۆئەم بنەمایە ئەوەیە کەپەروەردگاری بەرز وپیرۆزمان لەهەندێ شوێنی کتێبەکەیدا دەفەرموویێت :( وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)(الذاريات:٥٦)واتە: بێگومان من پەری و ئادەمیزاد م دروست نەکردووەتەنها بۆ ئەوەنەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن, ( وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ) (النحل:٣٦)واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دووره پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر،,( وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ) (التوبة:٣١)واتە: فەرمانیان پێ نەدراوە بێجگە لەوەی کە یەك خوا بپەرستن کە هیچ پەرستراوێك نی یە بێجگە لەئەو پاك و بێگەردی بۆ ئەو(خوا) لەوەی دەیکەنە هاوبەشی, (وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ) (البينة:٥)واتە: لەگەڵ ئەوەشدا کە فەرمانیان پێ نەدرا بوو مەگەر بەوەی کە پەرستشی خوا بکەن بەدڵسۆزی ملکەچی بۆ بکەن خۆیان بە دوور بگرن لە هەموو بیرو باوەڕێکی خوارو خێچ, (فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا) (الروم:٣٠)واتە: کەواتە ڕووی خۆت ڕێك بکەرە ئاینی ئیسلام پاك و ڕاست بۆ خوا (شوێن ئاینی) داهێنراوی خوا بکەوە کە خەڵکی لەسەر دروست کردووە , (وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ) (الأنبياء:٢٥)واتە: وە ئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێك نی یە کەواتە تەنها من بپەرستن...

کەواتە بابەتی کوفر بەطاغووت، ئامانجی گەورەی پێغەمبەران بوو هەتا گشت کاتەکەیان داگیرکردن، هیچ شتێ سەرقاڵیانی نەکرد لەو بابەتە، هیچ ڕێککەوتنێک نەبوو تێیدا، ودۆزینەوەی ڕێگاچارە لەم بابەتەدا بوونی نییە، هەر لەپێناو ئەمەشدا فەرمانیان پێکرا شمشێریان هەڵبکێشن وسووپا ئامادەبکەن، وگیان ببەخشت، چونکە پێویستە یەکلابکرێتەوە، کەکێ پەرستراوە بەحەق ئایا طاغووتەکان یان الله -واحد القهار-؟

دەسا ئاگەداربە ئەی موسڵمان تاکو ڕزگارت بێت ئاخیرەتت لەدەست نەچێ لەپێناو چۆدادان بۆطەواغیتەکان، یان شتی تر سەرقاڵت بکات هەتا ئەوکاتەی حەقی ئاخیرەت نەدەیت، وسەرقاڵی بانگەوازی گەلی بانخواز وفەتوادەر ومامۆستا وسەرجەم جاهیلەکان لەخشتەت نەبات ئەوانەی کەجاهیل ونەزانن لەمەبەستەکانی ئیسلام وڕاستەقینەی شرك وهاوبەش پەیداکردن، وواتای (لا إله إلا الله)، چونکە ئەوان ئەوانە زیادەڕەوییانکرد لەزانست هەتا ڕایانی کێشا بەرەو هاوبەش پەیداکردن بۆ الله -عز وجل، وهەوڵی زۆربەی بانگخوازانی ئێستا سوودی نییە، چونکە پێچەوانەی ڕێبازی پەیامبەرانە الله پەنامان بدات.

وشەیطانە مرۆیی وجنۆکەییەکان کاریانکرد لەسەر دوورخستنەوەی خەڵکی لەتەوحیدی دڵسۆزانە، بەجۆرێک فەرمانیان پێدەکەن بەبەندایەتی کردن بۆجگە لە الله -عز وجل- وبۆیان دەڕازێنێتەوە بەندایەتی بۆ غەیری الله وگێڕانەوەی حوکم بۆغەیری الله -عز وجل-، هەروەک لەفەرمووده قودسییەکەی صەحیح موسلمدا دا هاتووە.

**بابەتی : حیکمەتی ئەوەی الله یەکەم شتی فەرزکردووە لەسەر بەندەکانی کوفر بەطاغووتە :**

بۆمەبەستی هێنانەدی ئامانجی بەدیهێنانەکە کەئەومیش بەندایەتی بۆ الله یە کە حەقە وپێویستە بەتاک دابنرێ.

## بابەتی پازدەهەم : علەتی پێشخستنی کوفر بەطاغووت لەسەر ئیمان بە الله:

ئایەت هاتووە بەپێشخستنی کوفر بەطاغووت بەسەر ئیمان بە الله وەکو الله تەعالا دەفەرموویێت: (فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ )(البقرة:٢٥٦)

واتە: جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ تاغوت ـ (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە

وئایەتی تریش هاتووە بەپێشخستنی ئیمان بەسەر کوفر بەطاغووت هەروەک الله تەعالا دەفەرموویێت: (اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ) (النحل:٣٦)واتە: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دووره پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر،

کوفر بەطاغووت پێشخراوە بەسەر ئیمان بە الله ئەویش ئەوەیە کوفر بکات بەگشت پەرستراوێک جگە لە الله (ﷻ) پاشان دەستبکات بەچەسپاندنی ئولوهیەت بۆ الله (ﷻ)، ئەمەش داواکراوی (لا إله إلا الله)یە وپێشخستنی نەفی بەسەر ئیثباتدا پێویستە، و الله کوفر بەطاغووتی خستەپێش ئیمان بە الله لەبەر گرنگیەکەی

وبۆئەوەی کەس وانەزانێک کەهاتووەتە ناو دینەوە یان ئیمان وئیسلامەکەی لێ وەردەگیرێت لەکاتێکدا کوفری نەکردبێت بەطاغووت، هەروەک ئەوە لەبابەتی شیرینکردنە لەپێش بەتاڵکردنەوە، چونکە لەپێش تەوحید پێویستە شرك لاببرێ وپاک بکرێیتەوە لەخڵت وپیسی شرك.

کەواتە پێسخستنی کوفر بەطاغووت بەسەر ئیمان بە الله سوود ومەبەستی گەورەی تێدایە لەوانە:

یەکەم : بەکەم دانەنانی کوفر بەطاغووت، وڕونکردنەوەی ئەوەی بنەمایەکە غەیری ئەوەی لەسەر بنیات دەنرێ.

دووەم : پێویستە کوفر بەطاغووت بخرێتە پێش ئیمان بە الله وە، وئەگەر ئیمان بخرێتەپێش کوفر بەطاغووت ئەوا ئیمان سوودێک ناگەیەنێت بەخاوەنەکەی ئیلا لەدووای کوفر بەطاغووت وپاکبوونەوە لەشرك وهاوبەش پەیداکردن.

سێیەم : ئیمان بە الله بەتەنها ئیمان بەطاغووت ناکرێ کۆبکرێنەوە لەیەک دڵدا چونکە ئیمان بەتەنها پێویستی بەلابردنی شتی ترە، لەفەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) : (ئیمان وکوفر کۆنابێتەوە لەیەک دڵدا) صححه الألباني، کەواتە یان ئیمان بە الله وکوفر بەطاغووت، یان ئیمان بەطاغووت وکوفر بە الله تەعالا.

## بابەتی شازدەهەم : ڕێکخارییەکانی طاغووت وتایبەتمەندییەکانی:

١ -هەرکەسێ صیفاتێک لەصیفاتەکانی تایبەت بە الله (ﷻ) بداتەپاڵ خۆیەوە.

وەکو پەرستن وئولوهیەت یان ڕبوبیەت یان زانستی نادیار(علم الغیب) یان زانستی گشتگیر(علم الشامل) یان بەشەرعیکردن وحوکم کردن یان توانای تەواوەتی(قدرة التامة) یان سوودگەیاندن وزیانگەیاندن یان بێ کەم وکوڕی(الکمال).

هەموو کوفرێک یان هەموو کافرێک طاغووت نییە، بەڵکو طاغووت ئەوەیە کەزیاد لەسنوور دەربچێت لەکوفر وزوڵم وزیادەڕەوی(طغی) وخۆزاڵ کردن(تجبر).

٢ -هەرهەموو سەرە گومڕاکەرێک بانگەواز بۆ باتڵ وبڵاوکردنەوەی زوڵم وگەندەڵی بکات.

٣ -هەرکەسێ خەڵکی بەرەو پەرستنی جگە لە الله بەرێ بخات، وەکو سیحرباز وجادووگەر وبانگخوازی شرك.

## بابەتی حەڤدەهەم : سێ تایبەتمەندترین تایبەتمەندییەکان طاغووت:

١ -هەرکەسێ صیفاتێک لەصیفاتەکانی الله بداتەپاڵ خۆیەوە وەکو زانستی گشتگیر وپێشوو ونادیار وتوانای تەواوەتی وحوکم وتەشریع وفەرمان وگوێڕایەڵی وشوێنکەوتن وخۆشەویستی.

٢ -گومڕاکردن وگەندەڵی بڵاوکردنەوە وڕێگری لەخەڵکی بۆ دین.

٣ -هەرکەسێ نەفی صیفاتەکانی الله بکات وحەقی الله نەدات لەصیفاتەکانیدا.

تێبینی : ڕەنگە هەندێ کەس لێکی بداتەوە بەجەهلی بەشێک لەطاغووتەکان وهەندێ شێوازی کوفر پێی هەربۆیە پێویستە لەسەرت تایبەتمەندییەکانی وڕێکخارییەکانی بزانیت.

## بابەتی هەژدەهەم : بەشەکانی طاغووت، طاغووت ئەکرێتە سێ بەشەوە:

١ -طاغووتی پەرستن : هەموو پەرستراوێک لەبری الله (ﷻ) ئەگرێتە خۆیەوە، ئەگەر لەزیندەوەرەکان بێت وەکو فریشتەکان یان مرۆڤ یان جنۆکە ئەوا پێویستە بەڕازەمەندی خۆی بێت بۆئەوەی بەطاغووت بناسرێت، بەڵام ئەگەر لەبێ گیانەکان یان ئاژەڵەکان بێت ئەوا ڕەزامەندی خۆی نابێتە مەرج وڕاستەوخۆ بە طاغووت ناودەبرێت.

٢ -طاغووتی شوێنکەوتن : ئەمانە ئەگرێتە خۆیەوە; کاهن وجادووگەرەکان وزانا گومڕاکەرەکان وبەندەکانی زیادەڕەو کەهەرچی بڵێن گوێڕایەڵی دەکرێن، ولەدژی شەرعی الله دەوەستنەوە ( ﷻ ).

٣ -طاغووتی گوێڕایەڵی : حوکمڕان وسەرکردە وسەرۆک وئەمیر وفەرماندەکان دەگرێتە خۆیەوە ئەوانەی کە بەغەیری قورئان وشەرعی الله حوکم ئەکەن وشەریعەتی الله ودینەکەی پشتگوێ ئەخەن وخەڵکی حوکم بۆئەوان ئەگەڕێننەوە، ئەوانیش حەڵاڵ کراوەکانی الله حەرام ئەکەن یان حەرام کراوەکانی الله حەڵاڵ ئەکەن وئەوانەش کە گوێڕایەڵییان ئەکەن ئەیانکەن بەهاوبەشی الله وبەم جۆرە ئەوانیش ئەبنە هاوبەش پەیداکەر(مُشرك).

کەواتە هەرشتێ لەبری الله بپەرسترێ ئەوا طاغووتە، وهەرشتێ لەبری الله گوێڕایەڵی بکرێ ئەوا طاغووتە وهەرشتێ لەبری الله شوێنکەوتنی بۆبکرێ ئەوا طاغووتە.

ئیبن سەحمان دەڵێت : (طاغووت سێ جۆرە : طاغووتی حوکم، طاغووتی پەرستن، وطاغووتی شوێنکەوتن وگوێڕایەڵی) . الدرر ۱۰/۵۰۲.

ئیبن قەییم دەڵێت : (هەرشتێ بەندە سنووری تێدا ببەزێنێت لەپەرستراو یان شوێنکەوتراو یان گوێڕایەڵی بۆکراو).

**لەم پێناسەیەیشەوەبۆمان دەردەکەوێت کەطاغووت ئەکرێتە سێ بەشی سەرەکییەوە:**

۱ -پەرستراو: (وَالَّذِينَ اجْتَنَبُوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا) (الزمر:۱۷) واتە: جا ئەوانەی کە خۆیان دوورە پەرێز گرتووە لە هەموو ئەو شتانەی خەڵکی دەیپەرستن , (وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ) (المائدة:٦٠) واتە: تاغوت پەرست و بت پەرست

۲ -شوێنکەوتراو: (وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ) (البقرة:۲٥۷) واتە: ئەوانەش کە ڕێبازی کوفریان گرتۆتەبەر، یارمەتی دەرەکانیان تەنها ـ تاغوتەکانە ، (وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ) (النساء:۷٦) واتە: ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی ستەمکارو زۆردار و (تاغوت)دا دەجەنگن , (يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ) (النساء:٥۱) واتە: باوەڕیان بەفاڵچی و جادووگەرو بت و پەیکەرو شەیتان و ... هەیە

۳- گوێڕایەڵی بۆکراو وحوکم گێڕانەوە بۆی : (يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ) (النساء:٦٠) واتە: دەیانەوێت ڕووبکەنە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن

## بابەتی نۆزدەهەم : سەرکردەی طاغووتەکان:

موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب دەڵێت : طەواغیتەکان زۆرن بەڵام سەرکردەکانیان ئەکرێتە پێنج جۆری سەرەکییەوە:

یەکەم : شەیطان -لعنە اللە. -

دووەم : حوکمڕانی ستەمکاری شەرع دانەر کاتێک حوکمی اللە بگۆڕێت، بەڵگەش فەرمانی اللە تەعالایە کەدەفەرمووێت: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ ...) (النساء:٦٠) واتە: ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو (دووڕووانەی) لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانەکراوە و بەوەش کە پێش تۆ ڕەوانەکراوە (بۆ

پێغەمبەران)! کەچی دەیانەوێت ڕووبکەنە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لەکاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە باوەڕیان بە (تاغوت) نەبێت

سێیەم : ئەوەی کەحوکم دەکات بەجگە لەئەوەی کە الله دایبەزاندووە(قورئان)، بەڵگەش فەرمانی الله کەدەفەرموویێت : (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة:٤٤) واتە: جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا دایبەزاندووە، ئائەوانە بێ باوەڕن.

چوارەم : ئەوەی کەبانگەوازی زانستی نادیار(علم الغيب) بکات.

پێنجەم : ئەوەی کە بپەرسترێ لەبری الله وئەویش ڕازیبێ بەو پەرستنە.

ئەم جۆرەش ئەکرێتە دوو بەشەوە:

١ -بانگخوازی خۆسەپێنەر : ئەویش هەرکەسێکە بانگەوازی خەڵکی بکات بۆپەرستنی خۆی.

٢ -ڕەزامەند : ئەویش هەرکەسێکە ڕازی بێت بەپەرستنی خۆی هەرچەندە ئەگەر بانگەوازی خەڵکیش نەکات بۆپەرستنی خۆی.

کەواتە پێشەوای بانگەواز سەرکردەکانی کردە پێنج بەشەوە کەئەمانەن:

شەیطان وشەرع دانەر وحوکمکردن بەجگە لەوەی کە الله دایبەزاندووە وبانگەوازی زانستی نادیار وبانگەوازی ئولوهیەت کەبانگەوازبۆپەرستنی خۆی بکات یان ئەوەی بەئەمە ڕازی بێت.

دوو خاڵی تێدا کردە حوکم وشەرع دانان کەئەویش بەڵگەیە لەسەر ترسناکییەکەی .

## **بابەتی بیستەم : هەندێ شێوازی طاغووتەکان کە لەبری الله ئەپەرسترێن:**

١ -شەیطان:

ئیبلیسی نەفرەتی، ئەوەی کەسوێندی خوارد وچەسپاندیە سەرخۆی کە بەندەکان تووشی فیتنە بکات لەبەندایەتی الله وە بۆ بەندایەتی شتی تر.

**ئەگەر بووترێ : طاغووت ئەوەیە کە بپەرسترێ، لەکوێ خەڵکی شەیطان ئەپەرستن؟**

